**پێشکەشە بە:.**

**سەهەندو نیگا....**

**ئـــەو دوو پەپولـــەی باوەشـــێنی بـــوونم دەکەن**

## بەرزە فڕ

ئەستێرەیەک لێرەوە ڕۆی
شەوی بە نیشتمان سپارد
ئەستێرەیەک...
لەسەفەری هەڵوەرین و
ترازانی خانەکاندایە،
ئەو لەبەرزیدا دەوەرێ و
لەنێو گەردەلولا دەمرێ
لە عیشقێکا دەتوێتەوە

هەر لەپێکەنینی تۆ دەچێ
لە جولان و....
هاتو چوونی تۆ دەچێ،
تا نەگا بە جەستە سووتان
خۆی بەئایندە ناسپێرێ
ئایندەیەک....
هەر لەخەونی (بابە تۆم ) و
خورەی کانی کوێستان دەچێ،
چی مرۆڤی ئێرە هەیە
چی باڵندەی بەرزە فڕو
دارستانی سەوز هەیە
لەنەوای ئەودا دەخەون،
ئەستێرەیەک...
لەبەرزیەکی سەیرەوە
بەرەو روبارەکانی ئەودیو...
بەبێ ئاوڕی بارگاوی
بەبێ تۆزو...

ڕێژنەی نیازگی گڕاوی،
ڕوناکی لێهەڵدەوەرێ
بۆ ئێرەدێ و...
بەجەستەیەکی سوورەوە..
سنوورەکان تەیدەکات و
لەنێو پرچی ئاڵۆزکاوی
ئەوکیژانەدا مت دەبێ
کە هەمیشە لەئومێدان،
کە هەمیشە...
لەدوو توێی بەخت هەستانا
نوشتەکانیان دەسوتێنن،
شمەکی کچێنی و...
نەریتی کۆمەڵگا هەڵدەوەرێنن،
ئەستێرەیەک ...
لەبەرزییەکی سەیرەوە
بۆ ئێرەدێ،
لەدوا وێستگەی سەفەرایەو

بەسەر نیشتماندا دەباری..
بۆ ئێرە دێ
ئاخی پڕە لە ڕوناکی و
بەسەر هەموماندا دەباری.

* * *

ئەستێرەیەک لەوێوە هات
بەرەو مەزراکانی ئێرە
ڕوناکی لێهەڵدەوەری
هەورێکی دیش هەر لەوێوە
بە ئاسمانی ئێرەدا دێ
نە نمەی باران و بەفر دەبارێنێ
نە تەرزەی لێهەڵدەوەری
لەویوە دێو...
ئێرە لەنێو تەمێکی خۆڵەمێشیدا
لەنێو شەپۆلێکی سووری

ڕووبارەکانی ئەوێدا  
نغرۆ دەکا،  
خۆڵبارینەکانیش لەوێوە  
بەئاسمانی ئێرەدادێن،  
لەودیووەوە....  
دزە دەکەنە کەناری...  
سنوورە دەستکردەکان و  
لەپاڵ تاشەیەکی کۆن  
تاشەیەکی دابێژراوی  
سەرلێوی سەنگەرێکی کۆن کۆن  
بەئارامی دادەبارن  
سەوزایی وێ...  
ئەوێی پڕپڕ لەقەوانی ژەنگاوی  
بۆنی خوێن و ....  
گوڵی کوێستانیان دەداتێ،  
کەچی ئەوان  
لەسەر بەستەڵکێ دەنیشن

لەجەنگی ئەسحابەکان و
هزری بەستووی خۆیان بچێ،
لەخەندەیەک توورە دەبن
ئایندەیان بتەکێنێ
ئاخ خەندەیەک...
بەنێو جوانیەکاندا دێو..
بەنیشتماندا رەتدەبێ،
خەندەیەک...
رێک وەک ئەستێرەی رژاوی
گیانی سورو بەرزە فڕێ ...
پێشمەرگەیەک.

# ڕۆژە ناسکەکان

بەناو مناڵیما هاتم
چەند کەلا شوشەیەکی لووس و
هەندێ بەردی دارلاستیک و....
کۆمەڵێ گەمانم دیتەوە،
بەوێدا...
بەناو ڕۆژە ناسکەکانی
تەمەنی بێخەتاما ڕەتبووم
هەندێ قەوانی زەردوو لووس

لەباخەڵما زرینگەیان دەهات
نەعنا رەنگاو رەنگەكان و
ئەو فرمێسكانەم دێتەوە
كە قەت لەوەرین ناكەون،
گەڕامەوە ئەو رۆژانەی
لە قەرا قەرایەنی شەوان و
لەروبارەكان دەترسام
لەبەردی لووس و شەپۆل و
تەڕبوونی جەستەم دەترسام،
دەخلیسكام...
نازانم بۆ نەدەخنكام؟
رۆژانێك بوو...
منی بردە ئەو تەمەنەی
دەنگم گۆڕا
تەمەنێك بەخۆشەویستیدا هات و
بەدروشمی سەر دیوارەكاندا رەت بوو،
بەرابوون و....

خۆشاردنەوەی ڕاستەقینە
بەکۆتا هات
تەمەنێک
هەر لەدراماو خەون دەچوو
بۆ یەکەم جار...
پەنجەم بەپەنجەی کچێ کەوت
بۆ یەکەم جار
گوولەی بێقەوانم وێکەوت
بەڕۆژ نامەم دەگۆڕیەوەو...
بەشەو لەکۆڵانی تارێک
کۆڵانێکی بێ مندالٚ و
بێ گەمان و بێ هیچ( دەنگێ)
ئەو دروشمانەم دەنووسی
کەئەوسا نەم دەزانی چین؟
ئێستاش هەروا دەیجوومەوەو
لەهەندێکیان بەگوومانم!
تەمەنێک بوو...

پێیکهاتە لەترس و رامان
ئاوێتە لەخۆشەویستی
تەنێ...
لەخۆشاردنەوەو راونان.
تەمەنێک...
ئەمرۆی لەهەناسەما رواند
ئێستایەکی گەلێ جیاواز
لە رابردوویەکی بەجێیشاو
ئەوسا لەخۆشەویستی کچێکا
وەکو بەفر دەتوامەوە..
لەخۆشەویستی خاکێکا...
نازانم بۆ نەدەکوژرام؟
کەچی ناوێرم باسیان کەم
ناناوێرم....
تۆزێک بەوێدا بچمەوە،
لەوێی ناسک و بەترس
پڕ لەوگەمانە شێتانەی

لەلای من قەوان وکەلا بوو
لای ئەوان ئێستا ئەتارین
تەمەنێک...
وەک حیکایەتی ئەو شەوانەی
ئێستا پێی دەڵێن ئەفسانە
وەک ئەو شەوە تاریکانەی
ئێستا پێی دەڵێن ئازادی
ئاخ تەمەنێک
زۆر بەخێرایی تێپەڕین
ئاخ ساڵانێک
هەر لەخۆیانەوە هەڵوەرین.

# دابڕان

لە ڕۆخی ڕوبارێکی لێڵکراودا
کۆمەڵێک ماسی ژەهراوی
دووا بریقەی سنگیان ونەکرد
لەودیو چیا بەفراویەکان
لەپاڵ تاشەریەکی کۆن و
پیرەدارێکی هەڵدێراو...
باڵندە ترسێنراوەکان،
یان مەلە ڕەتێنراوەکان

بەخورپەوە....
دوا هێلانەیان چێدەکرد
ئێمە لەوێ و...
بەر لە رەشەبای بارگاوی
بە تەزووی تیشرەبای کوێستان
بەر لە دواکۆچ،
بەر لە هەلا هەلابونی جێ ژوان
بەتولە رێیەکا هاتین
روناکی مەترسی بوو بۆخۆی
خلیسکان و هەناسەش ترس بوون
هاتین لە روناکی گەراین
کەچی رابردوومان ونکرد
هاتین باڵندەکان ماچ کەین
ئایندەمان لێ بەربۆوە
بوخچەکانمان خلیسکان و
توێشومان لێ خلۆر بۆوە،
بەتولە رێکاندا هاتین

بەو بزنە رێیانەی ئێستاش
تا هاوین هەرەبەفری لێ یە...
رێگایەکەو....
هەردەم پێویستیان پێ یە،

*   *   *

بەرۆخ روبارەکانا هاتین
بەو بوارانەدا دەرچوین
ماسیان رەتدەکردە کەناران
لەپاڵ بەردێکا دانیشتین،
تەڕ تەڕ ببوو بەفرمێسک و
سوور سوور ببوو...
بەوخوێنە هەڵوەریوانەی
دادەچۆڕان لە رێبواران،
هاتین هێلانەکان چێ کەین
باڵندە بەرزە فڕەکان....
لە کۆچێکی ناوەختا بوون

هاتین روبار رونکەینەوە
کەچی شەپۆلە هارو هاجەکان
هەموو شتێکیان رادەماڵی،
ئیدی نەبوارێک بۆمەما
نەبزنە رێیەکانیش دیارمان،
نەرابر دوومان دیتەوەو
نەلەئایندەش گەراین،
هاتین و.....
وردە وردە،
لەپاڵ تاشەو....
کەنارو چەرە رێیەکانا...
هەرهەموومان لێک دابڕاین.

# چراکان ناکوژێنەوە

**پێشکەشە بەو گوڵەی چرای ئەم شیعرەی داگیرساند**

*چراکان ناکوژێنەوە*
*دڵمان بۆ یەکتر دەسووتێ*
*ئەوەی حەزکا جیاببینەوە*
*لە خۆشەویستیی مە ناگا.*
*ئێستا سەردەمی بەرگری و ...*
*سبەی سەردەمی بەرگری و ...*
*بێشک ئایندەمان ڕوونە*

ئاێندەی ئەو حەزە سوورەی
بە بنارا هەڵدەگرێ .
باخۆمانی پێداپۆشین ،
لە گەڵیا بەرەو هەوارو
لە دووری یەكتر نەترسێین .
چونكە دەزانم عەودالی ...
مژدەی هەواڵەكانی تۆ
منیش نامۆو ..
بێزارم لەم شارە دوورە
ئەوەی فرمێسكم دەڕێژێ
یادەوەری رابر دوویەو..
بۆنی گوڵاڵەیەكی سوورە.

*   *   *

چراكان ناكوژێنەوە
خەو شەپۆلی دەریاكانەو

شەماڵێکی لێوەنایە
نەخۆشەکان بۆمە دەگرین
بێ ئەوەی لە نهێنی ئازارەکانی
ئاخ بگەن
زامەکانیان سارێژ نابێ ...
بە ئێمەوە ...
هەموو عاشقانیان خۆش دەوێ
برینەکان قەتماغە دەگرن
بۆ نەخۆشیەکەی مە دەگرین.
هەرکە سیمای من دەبینن،
دەزانن لە ئاخی تۆدا
گڕکانی ئازارێک هەیە،
دەزانن لەئاخی تۆدا
چرۆکان نابوژێنەوە،
لەئاخم دا ...
چراکان ناکوژێنەوە.
* * *

چراکان ناکوژێنەوە،
تاشە بەردێک لە رێ دایە و
سێبەر بۆ رووناکیم دەکا.
هاشەی رووبارێکی سەرشێت
دەست لە هیوام دەوەشێنێ،
ئەستێرەکان
لەنێو دووکەڵێکی چڕدا،
باوەشێنی یەکتر دەکەن
منیش لە گەشتێکی دووردا
ئاراستەی رووبارێک دەبڕم،
لە تەکانام ...
بەرەو بنزەی ئەم سەرچاوە
پشت لە ماندوو بوون دەکەم و ...
تۆش لە گەڵمای
لە گەڵمای بۆ هەڵگرتنی ئەم
چرایە

چیرۆکەکانی ئەم گەشتەم
لەگەڵ تۆدا ...
گوڵی سووریان لەبەردایە.

* * *

چراکان ناکوژێنەوە
خەمەکانمان رێبوارێکەو
شەقامەکانی خۆش ناوێ،
وڵاتێکی زۆر دوور دیارە
کاروانەکان بۆ وێ دەچن.
ئەگەر لەگەڵ خۆیان بمبەن
هەرگیز من بەتەنیا ناچم
ساڵانێکە لە سەفەری دوور دەترسم
چونکە تەنیایی ئازارە ..
تۆش ئەگەر ویستت بێیتە لام
نەبیە هاورێی ئەم کاروانە.

ده‌ست له‌ملی تیشك بكه‌،
به‌ دارستانا هه‌ڵزنێ،
من له‌ شارێك ده‌دوێمه‌وه‌
هه‌موو خۆرگه‌كانی تێدایه‌،
وایه‌ن له‌ وڵاتێكا گوڵم ،
ده‌رگای هه‌موو سنووره‌كان
نه‌ك هه‌ر بۆ تۆ ...
بۆ هه‌موو كه‌س ئاوه‌ڵایه‌.

* * *

چراكان ناكوژێنه‌وه‌
گۆڕستانه‌كان تاریك و
ژنه‌ چاو سووره‌ وێڵه‌كان
سه‌رنج له‌ داهاتووم ده‌ده‌ن،
به‌بێ مۆڵه‌ت ...
فوو به‌ ڕووناكیدا ده‌كه‌ن

لێیم ناترسن
چرای هیوامان کز دەکەن.
تۆش بەبێ دەنگ ...
چاو لە هاواری من دەکەی
فرمێسک بۆ چراکان دەرێژی
لەم گۆڕستانە تاریکە
بێ خواستی خۆت ...
خەریکی رووناکی بنێژی.

* * *

چراکان ناکوژێنەوە
رووناکی مۆم هەڵدەلووشێ و
ئەم پێدەشتە سوور دەنوێنێ
لە خۆمەوە گریانم دێ!
بریندارەکان دەناڵێنن و
ئێمەش بۆ یەکتری دەگرین

نەخۆشەکان ...
لە شکستی جیابوونەوەی ئێمە
ناگەن
کەچی فرمێسک دەرێژن
جەستەریان شین دائەگەڕاوەو ...
خوێن بە وورەمان دەبەخشن.
دەڵێن سەردەمی بەرگری و ...
ئافاتی لێک داببڕانە،
وەرن با گشت کۆببینەوە
جارێکی دی
زامەکانیان سارێژکەین و ...
خوێنێکی گەشیان بدەینێ .
با لەگەڵیان کۆچ بکەین،
دوورو نزیک هەر دەگەرینێ،

* * *

چراکان ناکوژێنەوە
پەنجەمان دادەگیرسێنین،
لێناگەڕێم دوورکەوێەوەو
لە دیدەی سەوزما بزربی
ئەگەر ئەم چرایەش کزبێ
بەتەمام خۆم بکەم بەمۆم
نیازمە لە نێو فرمێسکتدا
ئازارەکانی خۆمان و ...
عاشقانی جیهان بشۆم،
نەخێر هەرگیز
چراکان ناکوژێنەوە ....

**ڕێگای کوردستان ژمارە 287ی ساڵی1998**

# نیگا ئەفسوناویەکان

**پێشکەشە بەو جوانەی ئیلهامی ئەم شیعرەی پێ بەخشیم**

*خاتو نەدا ..*
*وا دوو دڵی لێکدی نزیک*
*گوێیان هەڵخراوی یەکترەو ..*
*بەبێ دەنگي*
*ڕێگایەکی دوور لەتدەکەن ،*
*تاوێ لە بۆسەی نیگادا ..*
*بۆ شەقکردنی ئەو بێدەنگییە*

چاوەڕوانی دەمی منی ،
تاوێکیش لە پرسەی خۆتا
دیاردەیەکی ئێجگار ونی !..
هۆ نەدا خان ..
دەبا چیدی
ئەم ڕێ دوورە دوورتر نەبێو ..
ئەگەر هاوڕێ و ..
پەیام گری خەمی منی ،
ئەوە بەزمانی تۆی ناسک
ئەوکاتەت باش ،
- دەبێ کام وەڵامە هەبێ ؟..
لەم وەڵامە ناسکە خۆشتر
هاوڕێیم باشتر.

*   *   *

لەوساتەوەی ..

ئامۆیوخەو ،

دەست لە ملانی یەکترین و ..

بۆ شاری دڵداری دەنوون

پرسیارەکان ،

بۆ فێربوونی ووشەی کوردی

تارمایی بێدەنگی دەجوون ،

شاعیر ئاسا

ووشەی ناسک هەڵدەبژێری

سات لەدوای سات

لەگەڵ دوانا ..

شەپۆلی ئەوینێکی خەستم

بۆ دەنێری ! ..

ئاخر ئەدا ..

وا بۆنی هەناسەی نەرمت

لەبەرین ئەو دوو لێوە ناسکە ،

بێ میکیاج و دەرمانەدا ،

تەزو موچورکم بۆ دێنێ ، .

زۆر نزیکە تاوێکی دی ..
هەناسەی من ،
ئەم ئارامییە بسوتێنێ .
وەرەو خاتر جەمبە لێم و ..
واز لەو باسە چرە بێنە ،
شان بخە ژێر نیگاكانم و ..
دڵی بێ ئارام وبنرێوم .
دەستەمۆکەو بیدوێنە،
نەبا تاسەو هەڵەی رێیەک
مەرگسان بۆ بکات بەدیاری ،
وەرەو تێکەڵ بە خوێنم بە ،
تا بتکەم بە نۆ بوکی نێو
بەفرو چیای کوردەواری

*    *   *

.

کچی شەرمن هۆ شەونم خان .

ئەی بوکی نێو بیرەوەری ،
نامۆیەکی وەک من پەڕیو.
لێم ناپرسي ؟..
چی لە نیگا ئەفسوناویەکان فێربووم هەتا
بەزمانی خۆت هەڵیرێژم ،
دە بپرسە بۆچی ئێستا ؟..
وشەی کوردی دەجومەوەو ..
لەسنگی تۆیدا دەنێژم .

# وەرین

بەوەرینی گەڵایەکو پەرتبوونی لانەیەک هێشتا
روبار لە شەپۆل ناکەوێ و
کاروانەکانیش لە سەفەر ،
دوێنێ لە کۆستێکا فرمێسک

بەکەفەوە دادەچۆڕاو
لافاوەکانی هار دەکرد ،
بۆیە مردنی یادەکان
یان وەرینی گەڵاو وەستانی هەناسە
لای من کتومت وێک دەچن
خۆ سەمای شێتانەو شین و
خاش خاش بوونی ...
ئاوێنەکانیش وێک دەچن
هی چ لە لەدایک بونی خۆم و
نهێنیە شاراوەکان نازانم ،
بۆیە لە یادمە دەترسام
لە مردن و ....
وەرینی گەڵاو .. ووشک بونی کانی و
ئایندە گەلێ دەترسام ،
ئاخر پەرتبونی هێلانەو
سیس بوونلی ڕووەک یەک شتن
بۆیە هەر بزر بوونێ

بە دووا كۆچ و خەونێكی ئەبەدی دەچێ ،
لێی دەترسم و
چرایەك لە ئاوا بوونی تارماییەكان بەدی ناكەم
لێ ووشكبوونەوە و مردن و ....
وەرینی ناكاو ئێستا
وەك سەرەتایەكی ترسناك
وەك رەشەبایەكی پاییزی
ئاورم پێدەداتەوە،
ئاوڕ لە خەتایەكانی بوون .
لەو چركە ساتە ژانانەی
چریكەی لە نیشتمان هەستاند
تائێستەی پێ لە دایك بووین
ئاوڕ لە هەرەتی وێڵ بوونی
گەمەكانی منالیم و ....
بزر بوونی ئەو كەتتانەی
ئێستا منالی من نایكا ....
ئاخر چۆن ئاوڕ لە پیریێی عاشق بوون و

دوێنێی خلیسكان و هه‌ستانه‌وه‌و
جارێكی تر ناسینه‌وه‌م نه‌ده‌مه‌وه ،
ئه‌وه‌تا ...
وه‌رینی گه‌ڵاو په‌رتبونی لانه‌كان هێشتا
ناسكترین ترسی من و ....
رووداوه ئه‌فسانه‌ریه‌كانی
ناو منداڵدانی ئه‌مرۆیه ،
چۆن نه‌ترسم ؟ ! ...
چۆن له هه‌ڵوه‌رینی گوڵ و
په‌رتبونی وویژدان و گه‌ڵاو ....
بزر بوونه‌كان نه‌ترسم ؟
ئاخر ئێستاش ...
له‌ناو درزو شه‌قار بوونی برینه‌كانا
گه‌رای ئه‌فسانه و
بریقه‌ی ئایدیای له نێودا ده‌نێژن ،
له ناو خه‌نده‌و ...
قاقای زه‌ماوه‌نده‌كانا ...

لەترسی بە فانتازیا بوون ...
یان سەوز بوونەوەو وێنک چوون
گەڵاو ....
باران و ....
مناڵی هەلا هەلا بوو دەنێژرن ..

**ژمارە 198ی کاروانی سالی 2005 بڵاوبۆوە**

# نیۆان

لە ڕوبایێکدا دوو ماسی
لە نێو ئەشکەوتێکدا کانیو ،
لە دارستانێکدا چریکە
لەکام شوێن یەکتریمان ناسی؟
لە نێو ئەو ڕوبارەیدا هاشەی
جەنگەڵەکانی لوول دەداو،
وشەکانی لێ قوت دەداین .
یان لەم ئەشکەوتە ترسناکەی،

رابردووی لێ شێت ده‌كردین
له‌كوێ یه‌كتریمان ناسی!
له‌ودارستانه پاییزییه‌ی
گه‌ڵاكانی به‌چریكه‌وه به‌سه‌ر
ئه‌ویندا
ده‌بارین
یان له داوێنی ئه‌وكه‌ژه‌ی
به‌رده‌كانی گشتی لوتكه‌و ،
داره‌كانی گه‌ڵا چرووو ،
هه‌میشه گوڵه‌كانی به‌هارین

* * *

ئه‌وساته ده‌خته‌م بیرنایه
كه‌فرمێسكه‌كان به‌هاربوون ،
خولیاكان ته‌ته‌رێكی وێڵو ،
ده‌وروبه‌ر یه‌كپارچه نێوان .
ته‌نیا ئاوازی ئه‌و چرپه‌ی

کە لەهەموو دیدارێکدا
بەسەر لاشەما دەتباراند .
ئەمەنی گیانم ون دەبوو
ئاوازەکانت لەمن و
خەندەکانی خۆت دەتۆراند،

* * *

لەنێوان دوو گۆڕستاندا....
یان لەنێوان دوو چاوی تێر ؤرستێکو
راوچییەکو
هەڵەتەبەرێ بۆ کورسی
ئێمە یەکترمان ناسی ؟!
بیرم نایە
تەنیا هەرەشەی هەورێکی بێ
بارگاوی و
چرەی دووکەڵێکی شینی نێو هەناسەو
قاقای پێکەنینێکی گڕی

دووژمنەکانم لەبیرە .
ئەگەرنا ئەو ساتەی نیگات
بەچاوی بێ پەنام بەخشی
من لەتەنیاییدا دەگریام ،
گریان بۆ داهاتوومان و ....
لەدەست دانی دوا هەناسە،
گریان بۆ هەڵخلیسکان و
رنینەوەی ساڵەکان و
لێدانی تۆفان و کرێوەو
رابردوویەکی لێڵ نەبێ ،
هی چ تارماییەکم بیرنایە
سێبەری ئەو پەنجەرە نەبێ
کە لەنێوان ،
روناکی مۆم و چرایەک
بەنەرمیو بێ ترسی سووتان
وەکو روانگە
هاواری کرد دوا نیگایە .

* * *

خۆشم لەم نێوانە ناگەم
لەنێوانی دوو سەدە داین
یان لە بەرینی دوو سنوورا ؟
لەنێوان دوو وەرزی دژین
یان دوو سەنگەر و زرێپۆش ؟
هێندە نەبێ
لەیەکەم دیداراگوڵێ لەنێوانی مە
هەڵوەری
لەیەکەم خەندە باران ،
هەنسکێ دەکەوتە نێوان ،
ئیدی هەر ئەوەندەم لەبیرە
کە رقم لەم نێوانە بێو ...
هیـ چ نێوانێکم خۆش نەوێ ،
چونکە تەریب بوونی ئێمەو ...

فراوان بوونی ئەم نێوانە
ئای كە چەند ناخۆشە گوڵم ،
ناحەزێ بیكات بەلانە !.

* * *

شەوێ بەدیاركانییەكو ،
باق و بریقی سینگی نێوان جوتێ
ماسیو
چریكەیەكو ،
بارینی هەنسكەكانا ،
نۆتەیەكم دەنووسیەوە .
ئەو شەوە بەدیار تاریكیو
زیكری مۆمێكی نیوەبوو
سەمای وشەیەكی ون بوو
نەخشەی نێوانێكی سپیم
بەهاورێیان دەبەخشییەوە .

شەقام یەکپارچە تاریکی
ئاسمان پڕلە هێڵی گڕو
هەرەشەی هەورێکی برسی ،
ئێستاش لەو دەرفەتە ناگەم
لەنێوانی ئەو پێڵوانەو
ئەو دوو تابوتە ناگەم ،
نازدارەکەم .
لەکوێ یەکتریمان ناسی؟!

**ڕێگای کوردستان ژمارە 591ی ساڵی 2004**

# گومان

عەریامێکە ،
پرسەی نەمەنێکی دۆڕاوم
بۆ ئەم چاخە بێ ئابڕووە
لەسەر تاتی ناخە درز بردووەکەی ،
ئەم روحە فرێوەم داناوە .
تێناگەم بۆ
لە ئازادی خۆم دەترسم ؟!
یان ، لەوانەی

خوێن وەکو بادە نۆش دەکەن ،
مین بۆ ئایندە و تیریش
لە داهاتووی ئێمە دەگرن .
عەریامێکە ،
پرسە لە ناخما زیندووەو
هەڵخلیسکان هەرزیندووەو
بێ ئاگاییو، بازبازێن و
زۆر شتی دیو،
زۆر هەڵوێست و بالۆرەی دی
هەر زیندووەو ،
تەنیا سێبەری گڵاوبوون
لە وڵاتەکەم تۆپیوە .
دەنا هەتا گومان مابێ
لە سێبەرەکەت دەترسم .. !
لەدرزی یاسا دەترسم ..!
لەهەناسەی بارگاویو
بارانی خۆر ئاوا دەترسم ،

ئاخ ولاتە دۆزراوەکەم ،
چەند ترسناکە ئەم سەدە
چەند لە مەسئولییەت دەترسم ؟

*　*　*

تۆزو خۆڵە
لە گەش بینی ئەم هەرێمە
پڕاو پڕ دیموکراسییە
خۆڵ بارینە
هی چ یاسایەک بە قەد ئەم پرسیارە چڕە
خاک و چیای ولاتەکەم ناشڵەقێنێ ،
هی چ یاسایەک ..
دژی ژەهری ترس و گومان
بەدی ناکەم ،
هی چ هێزێکی ..
بەرامبەر توانای جارێکی تر هەڵبڕان

بەدی ناکەم ،
جگە لە خۆ جوینەوەی ئاخ ،
جگە چاو لە خۆر ئاوابوون ،
جگە لە خلیسکانی زیاتر ،
چۆن نەترسم ؟
چۆن لە ڕاکێشانی ئەم گوریسە
رزیوەی روح
گومان نەکەم .. ؟
ئاخ ولاتە هەڵگرتاو و لەت لەتەکەم
چۆن لە پیربوونی ئەزمونێکی دوو جمکانە
شەق بە شەقێنی ئەفکارو ،
تەواو کێشە کێش نەترسم ؟
ئاخ بەستەزمان ..
نیشتمانە هەژارەکەم
*   *   *

چیبکەین وازوو

لە خلیسکان و تەقینی مین کەوي نابین
چۆن ولأتە کاول بووەکەم
بە پێدادان و جینۆساید
نەکەوت و هەر تەکانیدا ؟
ئێستاش لە نێو تۆزو خۆڵی
سەر لەنوێ زیندوو بوونەوە
ناخنکێین و نەوی نابین ،
چونکە خاراوین و هەتا
لە کەنارا ترس نەروێ و
خۆر لە شەقاما نەگیرێ
بەسێ یاسا ..
بە ئاوێتەبوون و
(سڕینەوەی) هێڵە سوورەکانی سنوور
کەوی نابین ..
ئاخ ولأتە بێ پەناو
خاوەنی دەرفەتێکی دی
لە لوتکەم و بانە خلیسکێم

دەستم گرە ..
بالەم ولاتە چڕە
پڕ لە سەرۆو ..
دنیایەک ئەفكاری كۆن و
شەقارێكی هات و نەهات
ون نەبم و دەستەمۆ نەبم
ئاخ .. بەهەشتە دۆزراوەكەم
دەستم گرە ..
با دووبارە و جارێكی تر نامۆ نەبم و
دووەم نەبم ،
هێی ڕۆژئاوای ترسناک و
ئاخ ولاتی ڕۆژئاوایی !

* * *

ئەم یاسایە
بەقەت راونانی زلهێزی ئەم سەدەیە قورس
نییە

هەتا پێمان هەزم نەكرێ
مەرجە خۆمان
ترسي جارێكی تر رەو و
خلۆربوون ئەنجن كەینەوە
ترسی جارێكی ترن بوونی
نێو قەباڵە نەهێڵین و
چرای ئاینده ببینین
ئاخ ولأتە زێدە شیرین و بێ تفەنگەكەم
هێی تفەنگە بێ فیشەك و یەدەگەكەم
باچیدی من
لە گێژەنی ئەم تۆزەدا بزرنەبم ،
ئاخ باچیدی
لەم زەمەنە بێ ئابڕووە ،
سەراب هیوام بزرنەكا .
ئاخ دڵە گەشتر بینەكەم
نیشتمانە شیرینەكەم
بۆ دوایین جار

لەنێو ئەم وڵاتە پڕ لە
کەف و.. دووکەڵ و.. تۆزەوە
دەی وڵاتە بێ تفەنگەکەم
من و ..
ئایندەو ..
روناکی
بدۆزەوە.

**رێگای کوردستان ژمارە 596ی ساڵی 2004**

# خوێنی شەهید

خوێنی شەهید ...
ئێستا لە وڵاتی ترس و
جەنگ تیێدا چێنراوەکەما ...
خۆڵە مێشێکی سووربووەو ..
بەسەر پرچی نەشۆراوی
مناڵە شەهیددا دەبارێ ،

بەسەر جەنگەڵێکی چڕی
ولاتێکی ترسناکی
پڕ قەوانی بەتاڵ کراوو و...
سەنگەری سەرکۆشکە بەرزەکاندا دەبارێ ،
خوێنی شەهید ....
بارانێکی سوور ئامێزەو
وەکو روبارێکی گەورە ،
بە شەقامەکان دا هاشەی دێ ،
چی منالی شەهید هەیە لوولی دەدا ،
بەرەو نەلکاوی ون بوون و ...
جارێکی تر شەهید بوون و
بیر چوونەوە .
دەبن بە پێخۆری ترسی
شەرێکی ئێسک و دەمار بڕ ،
راپێچیان دەکاتە نێو
هەناوی دایکی شەهید و
جەنگەڵی خەمێکی زۆر چڕ ،

خوێنی شەهید ....
لەگەڵ خوێنی گەش و برسی
نێو دەمارو دڵی گچکەی
منداڵە شەهید
ئێستا لە وڵاتی ترسو
جەنگ تێدا چێنراوەکەما
ئاوێتەیەکی بێڕەنگن ،
چنگ لە مێژوو
لە ئەزموونی قەتران ئاسای
ڕژێمی ئەنفال گیر دەکەن ،
خوێنی شەهید ....
لە رابردووی پڕژانی خۆی بە گومانەو
لەم دەنگی زیل و زنجیرەی
ئەمڕۆی سەرشەقامەکانی شار
بەگومانەو...
لەداهاتووی تەماوی ئێمە دەترسێ ،
خوێنی شەهید ....

ئێستا یەخەی گشتمان دەگرێ و ...
بەمافی ڕەوای دەزانێ ...
لەهۆی ڕژانی بپرسێ ،
خوێنی شەهید
ئاخ بۆ پڕژان و ڕژانی
خوێنی شەهید .

**ژمارە 220ی ساڵی 1996**

**دوو پارچە شیعر**

**(1)**

# (بەهار)

بەهار ئێستا قەرەجێكە

هەموو وەرزێ

بە نێو ڕووباری خوێنم دا

مەلە دەكا

دەخوازێ...

گەرمێن و كوێستانی لەشم

تەی بكات و

لەجەستەما چەند نێرگزی سەردەربێنێ
کەواتە سبەی بەهارم و...
زۆر نزیکە نەورۆزی من
چەند سنوری ببەزێنێ.

(2)

## تەرزە

لە گرمژنی ئەو هەوارنە دا نەچلەکێی
ئەوە هەڵسی لوتکەیەکیان هەڵشڕیوە
سپی وەکو نێو چاوی تۆ،
لەو بارانە سەربەکلاوەی
دەچۆڕێتە نێو لەشی تۆ سڵەکەوە...
بێشک جوڵەی وولاتێکی وەهای دیوە
چڕ وەکو هیواکانی تۆ،
هەورو باران
لەساتێکا بەسەر جەستەتا باریوە
کەوا سیمات گەلێ تەرزە.

دەشلێ گیان
وەرە نێو ئامێزی گەرمم
هەتا سەرما نەیکردووی
بەمرواری بەفر و تەرزە.

**لەژمارە 1137 ی ڕۆژنامەی هاوکاری ساڵی89**
**بڵاوبۆتەوە**

# دوو وێنە

*بەگیانی شەهید موختاری پێشمەرگە پێشکەشە*

*لەودیو پەردەی لەدایک بوون*
*خوێنی گوڵە مەرگێکی تر*
*ئاسۆی دوێنێی سوور داگەڕان ،*
*ئەمڕۆش لە کوچێکی تەسکا*
*دەرگاکانیان ڕاتەکاندو ....*

بۆ منداڵێکی یاخی بووی ،
چاوزیتی بیرگەش دەگەڕان ،
بەم دوو وێنە ...
زانرا کەوا ...
سبەی دەوری شار دەتەنن ،
ئیدی هەموو ...
بێ سێ و دوو و بێ چاوەڕوانی
بۆ بەرزترین لوتکەی ...
دەورو پشت و
باریکە ڕێکانیان دەڕوانی .

**1984**

## بۆ ناتاشا

تاریکیو سەرماو سۆڵەو ئێش
نەیتوانیوە ڕاتەزێنێ ،
بێ ڕاوەستان ...
ڕێی چۆڵایی لولت دەداو ...
لاکەونرکەت ، خوێنی خوێنەر دەپرژێنێ ،
هۆ ناتاشای ...
دروستبوو بۆ ڕێی پافێل و
دایە و زەوی ...
لە هەر هەنگاوێکی بەفرا ،

لەهەر جوڵەو ڕامانێکا ،
سەری سەدانی وەک قریسەر
بە باوەڕت دەکەی نەوی .
لەناو کلوە بەفردا تۆ
گڕو ...
مانای نەوەستانی
چیایەکی دامێن بەفری ،
دیاریدەی پاڵەی کوردستانی ،
ناتاشا ئەی دڵۆپە ئەشکی
دایک و ملیۆنانی دایە ،
دەزانی ئەو هەڵوێستەی
لەناو ناخی سوورت دایە
پڕ بە دەنگی گەروی ئێمەش
گریەو .. پێکەنین و.. ئێش و
ئاوازو .. چریکەو سەدایە ،

**ئەم شیعرە لەژێر کاریگەری رۆمانی دایك نووسراوە**

# حەز

وردبونەوەم لە جەستەی تۆ
جمکانەی دووکاتی دژن
بۆیە لێکدانی نیگامان
بروسکەی هەورو تەموژن
*     *     *
جاران سەرنجت لە ڕووی من
کەوتبوە نێو جیهانی نوێ
ئاوێتەی حەزو لەزەتت
لەخوێنمدا دێنایە سوێ

* * *

لەدیدەنی دوا جاریشا
دوورنیە گیانت بتەزێنم
ئەگەر دەستم بەنەرمی خزی
بزانە سینەت دەترازێنم

* * *

ئێستاش حەزدەکەم لە ژوانا
چەناگەو لێوی لەرزۆکت
بەدەم ڕاگرم و متت کەم
بەدەست خستنە ناو بەرۆکت

* * *

ئەوەتانێ چاوی دڵم
پێڵوی ئارامی لێک نانێ
شەو و ڕۆژ لە بۆ سەدایە
بۆ دیدەنی و ساتی ژوانێ

* * *

گەردەشتەوێ وەکو ئەوسا

تەتەری هاوڕازت زووبێ
دەبا ئەوجارەش شیلەی دەم
خۆراکی خوای ئارەزوو بێ

*   *   *

ئەوسا دەزانی نهێنی
خۆشەویستی لە کوێدایە
لێکدابڕان و ئاشتبونەوە
چ لەزەتێکی تێدایە

**1989**

# ترس

دەرگای دڵت زووکردەوە و ...
بێشک پەردەی
نهێنیەکانمت ترازاند
کە بەروحم ئاشنابووی
نەمدەزانی ! ...
تەنیایی و نامۆی چییە ؟ ..
نەمدەزانی ! ...
زیزبون و بێ تۆیی چییە ؟
دەرگای دڵت زووکردەوەو

خۆت ناساندو ...
گەلێ زوو فێری نازان بووی
نیگات لە چاوانم سەندو ...
هێندەش زوو فێری ترازان بووی .

*      *      *      *

کە خۆت هاویشتە ئامێزم
هەستم کرد دەنگی بانگۆزێک
نەرم ، نەرم ،
پەردەی تەنیایم دەدڕێ
زیاتر چۆڕایتە نێو خوێنم و
هەستم دەکرد حەز بێ ترس
هێدی ، هێدی
ئاوازی ڕابوون دەچڕێ

*      *      *

نزیکتر بووی

* * *

کەلە دەواری دڵت دام
بێشک تەنیایت هەڵگرتی و
نەتدەزانی پرس چییە ؟
کە خۆم لە تۆدا دیتەوە ...
ئەم دەزانی هەنسک چییە
ڕمان چییە ؟
ترس چییە ؟

* * *

چ زوو تووشی ڕۆین بووم و
بزر بویت و ....
فێرە غەمی قورست کردم
چ زوو وەئاگات هێنام و
بەم ناسکییە
فێری پرسەو ترست کردم ؟

*      *      *

ئێستاش لەودیو جەستەی شلم

کۆچ دەکەیت و ...

دەڕۆیت و هەربەرز دەبی ،

دەماری دڵم دەگوشی و ...

یاخی بویت و

بەسەربونما فەرز دەبی

*      *      *

گەت هات و

بزرتر بووی.

**لەژمارە 31ی رۆژنامەی ئاسۆی ساڵی 1990 بڵاوبۆتەوە**

# لێو

– 1 -

نەرم بەسەر سینگما بتکێ

با دڵم وەخەبەر نەیات ...

وورد پەنجەت بە ڕدێنما بێنە .

بابۆسەی چاو ...

نەتکا بە نیشانەی نیگا

لێوم ئیشکە

گرنگ نییە ئەگەر جارجار

تەڕایی لێوتی پێ بگا ! ...

-2-

دەستم بۆ تووڵی دوگمەت خزی

ڕانەچڵەکی ! ..

تێر بۆنم کرد

گەردنو جوت مەمکو کەزی

نزیکتر بووی،

لە ئامێزما ! .

سێبەر بووە کە سێکوتۆ

نەرم تر بووی !..

لسۆم نزیک لێوت بۆوە

ترازایت ....،

سوور بویتەوە و

گەرمتر بووی .

-3-

بێیەک نازێن

کە گەرمایی پەنجەت بەردەستم دەکەوێ

خۆم دەزانم ...

دەمارو خوێن چۆن هەڵدەچێ ؟

کە گەرمایی پەنجەم بەر سینگت دەکەوێ
خۆت دەزانی لە شلبوونتا
تەزوو بەرەو کوێ ڕۆدەچێ ،
ئا بەم تەرزە بێیەک نازێن ،
بێ ئامێزوو ....
بۆنکردن و پەنجە گوشین
دڵ ناسرەوێ ،
بەس خوانەکا جارێ لێوم
بەر تەزایی لێوت کەوێ،

**لە ژمارە 52ی ساڵی 1990ی رۆژنامەی ئاسۆ بڵاوبۆتەوە**

**پێنج خشتەکی**

## ( مـــــاچ )

کچێک سەمای بۆ شیعرێک دەکردو نیگا رونەکانی خۆی تێدا بەدیدەکرد ، هەربەم تەرزەش خامە بەباڵای شیعرا هەڵدەگەڕاو خوێنی خۆی تێدا دەدۆزیەوە . منیش لە سوچێکەوە چەند ماچێکم بۆ ئەم دوو تابلۆیە هەڵدا ، ئەوەی مەبەستم بوو بەدەوی عیشقە پیرۆزەکە بوو ، کەچی سەرنجم دا ماچەکان و هەردوو تابلۆ ئەوا یەکتری دەلسەنەوە ، هێشتا ئەو دیمەنە سێبەری لەسەر پەردەی چاو دەلەرزی کە دەستی شیعرێک قەدی خامەی گرت و خۆی پێ نوسی ، لێنەگەڕا تەواو لەنێو درزی نیگاکاندا خۆم گەرم کەمەوە ، کە خۆشمی ئاوێتەی ئەم دیمەنە کردوو لەبەردەم ئەم شیعرە خۆڕسکەدا چەقاندمی .

چییە ئەم کەزیە پەشمینە دەڵێی هۆنراوەی گۆرانە
بە دیمەن شای جوانانە ، بەزمانیش زادەی سۆرانە
هەناسەی وەک شەماڵ نەرمەو .. دڵی بارانە بۆرانە
هەموو جوانی دنیا هەردەم ، لەبەر ڕوتا لە گۆڕانە
دەبێژەو دەستخە نێو دەستم ، دڵم بۆت هەرلەنۆرانە

* * * * *

لە ڕەنگدا نێرگزی بەفری و لەباڵادا چناری تۆ
لەماڵا تیشکی زێڕینی و ، لە چۆڵاکانی بناری تۆ
لەبۆمیش ئەی پەری هەستم هەموو دەم هەربەهاری تۆ
ناسکە ڕێواسی گوڵاڵەی خونچە گوڵی هەناری تۆ
وەرە و مەمم لە سینگ هەڵسوو دەرفەت نزیکی تۆرانە

* * * * *

دەڵێن بای ڕێبەندان ساردەوکوڵەی ڕێبوار دەتەزێنێ
کەڕەنوو هاتە سەنگ گرانی ، چی لە ڕێبێ دایدەخزێنێ
کەچی سروەی هەناسەی تۆ زریانی ڕێم دەبەزێنێ
جوانیتە هۆشلێ گیان ، ڕەنووی شیعرم دەبزوێنێ
دەجێکەو دەست بەتۆبگرم ، سینەم لێی داوە مۆرانە

* * * *

دەبینم تاوێ وەک تیشکی و .. تاوێکیش وەک نەورۆزی تۆ
کەواتە گشت دەمێ ڕونی و وەک چرای شەو پیرۆزی تۆ
لەبۆیەش هەر لەنێو هەستا بوْن نێرگزو تیرۆزی تۆ
ئەوا ئێستا ئەی لێو بارێک ، بڕیارە و بۆم سەرهۆزی تۆ
دەبێنەو ماچێکی نێودەم لەبەردەم ئەو خۆخۆرانە

**لەگۆڤاری ئۆتۆنۆمی ژمارە 60ی سەرەتای 89 بڵاوبۆتەوە**

# سێ وێنە لە كوخەكەی مام تۆمدا

**( یەك )**

كچی خۆزگە ئیڤانگلین
هۆ خەندەی ڕوی كۆیلەكان و ...
خەم ڕەوێنی ...
دەیانی وەكو بابە تۆم ،
گوێم بۆ هەڵخە
تابزانی .. !

چەند عاشقی
ئەم دڵە بچکۆلەیەی تۆم ،
ئێڤا ئەشکم
هۆ تەکان و گوڕ و هێزی
ڕەوی هەنگاو و ئەژنۆم
دڵنیابە ...
تۆ چەند تینوی تروسکەی خەندەی
سیمای ڕەشی بابە تۆمی
ئەمن ئێستا گەلێ زیاتر
چاوەڕێی دەرکەوتنی
تیشکی ئاسۆم ،
ئێڤانگیلین ، ئێڤانگیلین
ئێمەش زادەی هەمان زام و
هۆزو .. جیلین .

**(دووەم )**

ئەوەتا خاتوو ئەلیزا

هیواکانی لە باوەشدا حەشارداوە و
وەکو پڵنگ
لە نێو ئاودا
تاشەو بەستەڵەک دەشێلێ
لە تاو مەزات
لە تاو جەرگ و جیابونەوە
خاکی شیرین جێدەهێڵێ
بابە تۆمیش ...
لە ژێر چەپۆکی دێوەزمان
لە گیانە لاو ئازاردایە
کەچی هێشتا ..!
چەکوشی ووشەو
زایەڵەی چریکەو شتی دی
بە گوێی دڵدا دەووەشێنێ ،
داستانێکی نوێ بۆ کویلەو
دیلەکانی جیهانی نوێ
دەڕسکێنێ ،

**( سێیەم )**

ئەوەتا کڕنوش بردن و ووشە جوین
لای بابە تۆم
دژو موچوڕکو ستەمە
بۆیە ئێستا
گیانی تۆم شوشێک خوێنەو
لە قوڵایی نێو جەستەمە ،

**1988**

# ئاشتی

نیشتمانی من خۆزگە بۆ ئاشتی نەبێ هەڵنایە
تاشەیەکی سەرەڕێیە و هەرگیز بەلافاو دانایە
ئێمە لەم وولاتەدا گرێ ئاشتی بەدەست دەگرینەوە
تێدەکۆشین و فرمێسکی منالە شەهید دەسڕینەوە
بورکانێکین و پشکۆمان بەسەر دوژمن دا دەبارێ
ئەوەی ڕێی ئاشتیمان بگرێ، بەرداشی ڕقمان دەیهاڕێ
وەرن باپێکەوە ئاشتی بکەینە دروشمێکی پیرۆز
پیرۆزتر لەناڵەی شەهید بە تینتر لە گڕی نەورۆز

*ئاشتی خەباتە بۆ ئێمە لە ناخیشماندا هیوایە*
*جەنگی سپی سەردەمەو تەکانێکی بە برِوایە .*

**کراوە بە سروود**

# بـــۆن

بۆنێ بەنێو هەنسکتداو ...
پێکەنینێ بە نێو گریان ،
لەکوێ یەکتری ببینین ؟
بۆکام ژوان ؟
بۆ سەرەتای کۆچێکی وون ،
یا بۆ نەخشەی لێک دابڕان ؟

*      *      *

بۆنی بە کەزیەکانتەوە
ووشەیەکیش ،
بە هەنسکت عاسێ بووە ،
تیشکێ لە نێو پێکەنین و ..
خەندەیەکیش لە نێو گریان .
من لە کوێوە دەست پێبکەم ،
ئەی چۆن ئایندەی خۆت دەوێ ؟
کە هەردوو لە یەکتری نەگەرین ،
بێدەنگی تارمایی ئاسا ،
نیگاکان وەکو برووسکە
هەورێکی ڕەش لولیان دەدا ،
ئێمەش لەوێ بزر دەبین ،
ئەوسا نە تۆ ووشەکانت دەناسیەوەو
نە منیش بۆنی کەزیت،
نە لەزمانی هەنسک دەگەرین
نە لە دواجاریش پێک دەگەرین !

* * *

شەقامەكان بۆنی هەناسەی تۆی لێدێ،
ڕووبارەكان ...
هەنسكەكانت قوت دەدەن
تارماییەك ،
باوەش بە سێبەرما دەكا
لە ساتێكی ڕابردووی تۆو ...
لە هەنوكەیەكی من دەچێ ،
تۆش لەنێو نۆتەیەكدا سەمات
بۆ گۆرانییەكی وون دەكرد ،
منیش ئاوازێكی وون و ...
هەڵپەركێیەكی ڕەش و سپی و ...
ژەماوەندێكی بەبێ بووك ،

* * *

لەكوێ یەكتری ببینین ؟

لەنێو ئەو خەونە ئاڵۆزەی
ترسی لە دەروونداروواند
یا لەسێبەری ئەو باوەشەی
بۆنی لە شەقامەکاندا چاند ،
لەکوێ یەکتری ببینین ؟
چۆن ئایندەمان داپۆشین ؟
پێیم بڵێ چۆن ...
لەنێو هەناسەیەکی عاسێ و
ئەو هەنسکانەی هی تۆن
یا لەنێو کەژاوەی گوڵێ
کە پێی نەنگە پەخشکا بۆن
پێیم بڵێ چۆن ؟

# توانەوە

لە توێی گەڵا وەریوەکان
یان لەناو لانەیەکی پەرتکراوی
باڵندەیەکی ترسێنراو ،
لەوێ ...
لە کەنار روبارێکی هەڵچوو
کەلێنی تاشەیەکی جێماو
یا لە گەردی هەناسەی
کۆترێکی بەرزەفڕ ...
من و ئەوینێکی تاسێنراو دەبینیەوە .

*   *   *

لەبن هەورە وەریوەکان ...
لەناو هەگبەیەکی پەرتبووی ـە
رێبواری سەفەرێکی وون ،
لەوێ ...
لەنێو ئەو تاراکێزر بوەی
لە فرمێسکەکانت ئالاوە
من و نامەیەکی گەچلاو
خۆت و ئایندەیەکی دی
بەدیار نسیێ و تابانێکا
بە نامۆیی دەدۆزیەوە

*   *   *

ئەگەر لە سەفەر نەترسی
یان لەو تەرزە بارانەی
بۆ تەنیایتان دەوەرێ

من وام لەناو ...
تەرزەیەکی هەڵوەریو
هەڵم گرەوە ...
بمخەرە بەرین ئەو لێوانەی
بە نەرمی تیا دەتوێمەوە
بۆ هەتایە بزر نابم
لەوێ ...
لەنێو گەرمییەکی بەسوێ
دەچۆڕێمە هەناوتەوە ،
کە گەیمە ناو ترپەکانی
دڵی پڕ لە ئەوینی تۆ ...
لەوێ دەنوم ،
ئیدی خاتون بۆیەکجاری
لەبەرین لێو و
هەنسک و پێکەنیندا دەنووم .

# تارمایی بیر

لە بزربوونم مەترسە
وام لەنێو تارمایی بیرتا ..
کاتێ ویستت بمدۆزیەوە ،
وریابە هەڵوێست بیرنەکەی !
وریابە ئەشک نە قۆزیەوە !

* * *

کەبیر لە من دەکەیتەوە ،
پەنجە بزێوەکانت شلکە

چونكە هەڵوەریوەمە بەرینی
ئەو پەنجانەی خامە دەگرن
چونكە چۆڕاوەمەتە نێو ئەو ...
ووشانەی تویێی نامە دەگرن .

*　　*　　*

چۆنت ووبست وا .. !
لە زنجیرەی ووشەكاندا ڕیزم بكە
چونكە لە تارمایی بیرتام
ووردتر لەگەڵ ....
ڕستەكاندا بمجوڵێنە
چونكە نیگام ...
لە مەلی حەزی نێچیرتام
پێت وانەبێ ! ...
هەڵمەت بۆ نێچیری حەزت
تەكانی ناكاوی بوێ ... و
پێت ستەم بێ
لە هەستانتا بەری دیدەت

گێژه‌لوكه‌ی خه‌م و ته‌م بێ ،
وام له‌ تارمایی بیرتا ...
كاتێ وویستت بمدۆزیه‌وه
ووریابه‌ ئه‌شك نه‌ڤۆزیه‌وه .

*　　*　　*

ئه‌و نامه‌یه‌ی
له‌ توێی ده‌ستتدا ده‌له‌رزێ
نه‌خشه‌ی گه‌ین ...
به‌ ترووسكایی گه‌وهه‌ره‌
له‌ بزربونم مه‌ترسه‌ ...
چیدی له‌نێو وێنه‌كانا
سۆراغی بونم مه‌پرسه‌ ،

*　　*　　*

حه‌زت لێیه‌ بمدۆزیه‌وه
وویستته‌ له‌ ئامێزما شلبی

وام لە کۆشتاو ...
دەبێ بە شانەی پەنجەکانت
پرچی ئاڵۆزم دابێنە
چونکە حەزمە لە گەڵتام
ویستە گشت دەم
لە مێز تام .

**سەرەتای 1990**

# چەند سەرنجە شیعرێ

**بۆکس**

لەژیانم دا تەنیا دوو جار
بۆکسی رقم وەشاندووە ،
جاری یەکەم :
چوارپەنجەی خۆم پێشکاندووە
جاردووەم :نێو چەوانی بەرامبەرم رۆشاندووە .

**جگەرە**

چەندی دیکەش بۆ ناخم خۆت بسوتێنی
وەک سوتانی دایکم نابی !

وەكو دەواى
سۆزى دەستى دايكم نابى !

**دار**

دار ، وانەم پێ لەبەر ناكا ..
دار ، لە قوتابخانەم دەرناكا ..
بەس دوو ووشە
بەسە بۆ وەى ووریاترم
بەسە بۆوەى ژیرترم .

**سەرین**

بەس تەنها تۆ
لەماناى دواخەوم دەگەى ..
بەس تەنها تۆ

لەخەوی ئەم شەوم دەگەی .

**موتوربە**

توخمی شاتووم
ڕێگا نادەم بمکوڵن و
سینگم کون کەن ،
ڕێگا نادەم
موتوربەم کەن .

**نێرگز**

ساڵی هەزارەها پەنجە
دەمگرن و تێر بۆنم دەکەن ،
بەس نازانم !
ئەوان بۆچی بۆنیان نایە
بۆچی ئەوان .

به‌زه‌ییان به‌ مه‌رگما نایه‌ ؟.

**خامه**

به‌ چاك و خراپ ده‌موه‌شێنن
ده‌مكه‌ن به‌ چه‌ك !
ده‌مكه‌ن به‌ گوڵ !
له‌سات و ناساتی دژو ئاسایدا
به‌ڵام كه‌ چۆڕایم بڕا
وام له‌ سه‌وه‌ی پێسایدا

**1990**

# پــەنا

پێدەچێ لە نامۆ بونتا
پێشهاتەکانت خۆش نەوێ
ئاوێتە بونی باران و ...
شەونمی گۆناو زایەڵەی
هەواڵەکانت خۆش نەوێ ،
لێرە شەماڵ بۆ باوەشێن ،
لەوێش لە ستاتیکاچوون
تاپیاسەیەک ...

بەناخی متبونا دەکەی
نەخشەکانت لە بیردەچێ
لەسەفەری ونبوون گەڕێ
وەرەوە دیار ئەو بەڵێنەی
تاشەکانی پێدەشکێنین ،
ئاخر نەبا ...
وونبونی ساتە کورتەکان
یان سەفەری ...
سنورە ئاژن کراوەکان
ئەو کۆچە بێ
فەنابوون و لێک دابڕان .
یان فراوانبونی نێوان .
ئاخر ...
لەم سەفەري وون بوونەدا
شەقامەکان ....
لەخاڵی بونەوەی سێبەرو
ووشک بونەوەی باران و

مرکانەوەی دەنگ دەترسن ،
رێبوارەکان ...
لە سەفەرێکی بێ پشوو و
دەریایەکی بە شەپۆل و ...
چریکەی نیوە شەو دەترسن ،
منیش لەتۆ و ...
لە کۆچ و لە یاخی بوون ،
لە گۆرانی ئەو دەقانەی
وێنەی ناو پەخشانەکان بوون
لەو سەفەرە ترسناکەی
لەیاد چونەوەی تێدایەو
سەرەتای بە دۆگمابوونە
لەو سەفەرەی
هەمیشە ترس
هەمیشە خزین و سەرەتای
فەنابوونە .
لە سەفەری وونبوون گەڕێ

نە دەوارێکی خاڵی ...
لە ڕێدا باوەشی هەیە
نە کەنارێکی بەهاری
یان دارستانێکی پڕگەڵاو
پیرە دەوەنێکی نیشتمان
بۆ تۆ سێبەرێکی هەیە ،
گەران بەدووی ...
ئایندەیەکی ڕاچەنیو
بەدووی خۆت و ..
ئێستایەکی خاڵی لەمن !
منێکی لێواو لێو لە تۆ
لە خۆت دا من دەبینیەوە ،
لە خوێنتداو ...
لەناو دەفری بیرەوەری و
ڕەنگدانەوەی ووشەی ناسک
لەخۆت دا من دەبینیەوە ،
تەنیاو تەنیا

لە ناو منای
ئەگەر چی بۆ ئایندە ئێستا
لە سەفەرێکی سەخت و وونای
بەڵام لە نێوان ساتەکان
من ڕابردوو و ئایندەتم
تۆش هەمیشە
بۆ خەوم سێبەرو پەنای .

# وون بوون

دەست مەخەرە نێو تەنیایم ..
بەسنگی کافوریت ئازێز
سەرنجی یاخیم ڕاکێشی
من وا لەنێو
شیعرێکی ئاڵۆزدا وونم و
تۆش هەروا دوورو نزیک دێی
لە هاتنتا هی چ نابینم و ....
کە دەشچۆڕێیتە نێو شیعرم

نازانم کێی ؟

*  *  *

بێشک وەرە نێو بیرمەوە
چۆن دێی وەرە
بەس لە دەرگای ووشەم مەدە
چونکە پەریکی ووشەکانم
چەکی دەستی بێ زامنە
بەخەبەرییێت زامدار دەبی
خۆ دەشزانی
زامی تۆ هەرزامی منە .

*  *  *

دەزانم ئێوانەو مەرگیشي تێدابێ دێی
دێی بەخێر بێی ...
بەڵام ئەگەر ئیلهام قفلی لە دەمم داو

ووشە نەیهێشت سەر هەڵبڕم
لێم نەڕەنجێی .

*   *   *

دڵم نایە بڵێم مەرە
چونکە هاتنت هۆکاری
چریکەو فرمێسکی خامەیە ،
لە هاتنتا شیعریٚ دەمریٚ و
لە زینز بونیشتا شاعیریٚ ،
کامیان بە لاتەوە نەنگە ؟
مەرگی ئازیز ،
یاخود کۆرپەی جەرگی منی
هەڵوەریو بە شیبای پاییز .

*   *   *

لەنێو دوو هێڵی تەریبا

نامۆیەکم ڕێم لێ وونە ،
ئیلهام بای وەشتی ناو مۆخم دەڕەتێنێ
ژوانیش ئەوا لە هاتنداو
خەریکە تۆزی تەنیایم بتەکێنێ
لە نێو ژوان و ژانێکا من
ڕێبواري ڕێی کاروان کوژەم
پاساری روح لە نیشتنداو
پەپولەی شیعریش هەڵفڕین
ئێوە بڵێن
پارچێک لە دڵم بترازێ
یان شیعرێکو....
مەودایەک ووشە هەڵوەرین.

**کارخانەی نەسیجی موصل**
**1989/8/25**

# نیگەرانی

لە سۆنگەی دووا خەونی هیوات ،
سەرنجم دا نیگەرانی
بێنواو بێخەندەو تەنیا
گرفتاری سەدان عەشقی لەیاد سڕبووی سەرگەردانی ،
سەرنجم دا .. کارەساتی دژواری بیر ....
ڕکابەری ڕۆژگار دەکا ،
لە ترۆپکی لوتکەی گیانت
ڕێچکەی ووشەی بەدڵ نەبوون

ئاراستەی كردگار دەكا ،

*    *    *

سەرنجم دا بیشەڵانی پرچی ناموت
پاییزی غەم دەی پێكێنێ
نەدەگەیمە هی چ باوەڕێ !!
بۆچی ... ڕوانگەلا ڕوولا شێواوت ؟! ! ...
تیشكی خەندە دەخنێنێ ،

*    *    *

نیگەرانی و ، لە باوەشی غەما دەژی
سەرهۆكەی پرسەی ئەوینەو ....
بۆیە ، لە دنیای ئاگرو ...
بێ باوەڕی تەما دەژی ،
نیگەرانی و ...

زایەڵەی هەنسكی شێتت ...
پاین چیپای باوەڕی من دەلەرزێنێ
پێیك دەداتە دەریای ماندوو ...
گەرداو ... گێچەڵۆكە ... زریان
لە تاوێكا دەبەزێنێ ،

* * *

هۆ ڕێبواری دووا كاروانی ...
شەكەتی ڕێنمای ئەوین .....
هۆ دیاردەی بەفرو كوێستان و .....
هەتوانی ئێشی دەمی برین ،
نیگەرانی ... هەتاكوكەی ... ! ؟ !
خۆشم دەوێستووی
وەرەو لە شاری دڵی هیوام ....
خۆت حەشاردەو ....
منیش لەدەروازەی چیپایێ ...

دووا هەریەکەلی خۆشەویستیم بۆ هەڵخستوی ،

لەبەر تیشکی لەرەی گرا ....

هەزار خەونی تیێک هەلکێشم

بۆ لێک بەستوی ،

دەفریشتەی ...

خواست و حەزو .. ئارەزوی دڵی تۆگرتووم

نیگەرانی بابسووتێو ....

چونکە بۆ دووا ئاواتی خۆم ....

خۆشم وویستووی.

**کاروان ژمارە 45ی حوزەیرانی1986**

# رازی حەزێکی تینوو

ئێستا بپرسە داخۆ من
لەکام لاری پشوم داوە ؟
چەند قەدبڕو هەڵدێرانم
لە پێچپێکا گرێداوە

*     *     *

بپرسە داخۆ چەند جاران
پەراسویان ئەنجنیوم ؟

لە چەند كەلەبەرو شوێنا
بەسەر خۆما ڕاچمیوم ،

* * *

بۆ ئەو نیگا ترازاوانە
گەلێ دڕكی تیژم جویوە ،
لە بۆ یەك ساتە ڕامانت
بەدەم گشت دارمیوە ،

* * *

ئەدی چەند جاران بۆ پرمەم
لەنێو جێدا ڕاچەنیوی ؟ ...
لەچەند ساتی دیدەنیدا ؟
پڕ بەدەم پێم پێكەنیوی

* * *

لەچەند ژوان و بڕیاردا تۆ ؟
بەرگی ختوکەت پۆشیوە ،
ئاکام لەچەند جەمسەراندا
پێکی ئازارت نۆشیوە ،
* * *
گەلێ لەم جۆرە بڕگانە !
پێک دەداتە دەریای سوورم ،
گەلێ ڕستەی پڕ لە گومان
نەندە بۆ ڕای بێ سنورم ،
* * *
چیشەن تۆش تۆزێ داخوڕیێو
لەم داوایەت وەڕسوڕیێوە ،
نەپای بەڵێنی چەند جارەت
بۆخۆت تۆزێ وەحەسیێوە ،

* * *

نەبا ئەڵقەي ئەم زنجيرە
پەنجەكانم دارزێنێ
لەم ترۆپكو هەورازانە
لەتيژ ڕەوا دام خزێنێ ،

* * *

خۆت دەزانی بۆ يەكتری
چەند هاوەڵی دەست گوشين بوين !
بۆ دوا مەزرای خۆشەويستی
چەند شەيدای يەك جێ نشين بوين ! ..

* * *

دە ئەم ئاواتە پڕسوێيەم
باڵەمێژی تۆ دەبينم ،

دەنگم بگا بەشاری خۆو
دەرفەت بێ بۆ پێکەنینم .

**کاروان ژمارە 62ی ساڵی 1988**

# کەزی و کلدان

هێماو پێوانەو کێشی
نەخشەی مۆخمم بۆ نووسیەوە ،
سەری لەقاند بۆ ئەندازەی خۆشەویستیم .
بۆیە هەر زوو سوور داگەڕاو ..
ووتی : لەسەر کام پێوەری ؟ ..
دەستیم خستە سەر دڵوبە ..
لەرەی دڵی بانگۆز ئاسام
ئۆیەی نینۆکی هەڵوەری .

*  *  *

پەنجەم بەر سێوی کوڵمەی کەوت .
ڕاچڵەکیو منی لەیاد چۆوە ! ..
ڕۆیشتو پێیم وابێ دەیبۆڵاند ...
سوراوی کوڵمەم لێ بۆوە

*  *  *

دەستم بە پەرچەمیا هێنا
دەتگوت فیزی کارەبایە ! ..
خۆزگەم خواست ...
مێش کردن و .. سپەراو
تەسریحە و .. لەف ولول .
هەرگیزاو هەرگیز نەبوایە .

*  *  *

پشتی چاوی شین شین وەکو.
جیٚ بۆکسی
یاری بۆکسێنە .
قژی کورت کورت دەتگوت ئیشکە
گیای هەورازو دامێنە .
پێیم گوت کچی باش بەو بەسە
ئەم کۆتە نوێیە بپسێنە .
ئەوە کلدان و هێشتنەوەی ..
شۆڕە کەزیش لەسەر خۆتە .
ووریابە ماف لێرەدانیەو ..
بەلکو بۆت نوێترین کۆتە .
زۆر دیمەنی لەم بابەتەو
وێنەی جوانم بۆ نووسیەوە ،
لەگەلیٚ ژواندا مت دەبوو و
ووتەی دەممی دەقۆزیەوە .
هەتا خۆی لەنێو کلدان و ...

کەواو مێخەک بەن و زوولفی
هۆن هۆن و بڵاوا دۆزیەوە.

**کاروان ژمارە 88 تەموزی 1990**

# دوندی مەم

ڕێبوارانی سەردەمی زوو
شەوانە گەر ..
لە ڕێی مەبەست دابڕابان ،
کۆ ئەستێرەی کاکێشانیان
دەکرد بە قیبلە نومای خۆ دۆزینەوە ،
خۆ گەر گرانیش داهاتبا ..!
ئەوە چینی پێدەگەشت و
چینێکیش دەکەوتنە هەڵپەی
نانی تۆ گەسک قۆزینەوە ،
بەڵام ئەی کیژی خوێن شیرین

خۆ نە لەرێ هەڵبڕاوم
خۆ بزرکەم ،
نە ئەوەندەش برسیم هەتا
تاڵ و تفت ،
هەموو شتێ
لەنێو لەزەتما مزرکەم ،
کەچی هەر حەوت چینی ئاسمان
شەوانە بەو چاوانەی خۆم
دەپشکنم و ..
ئەستێرەی لێ هەڵنا بوێرم ،
پەی بەهیچ ڕێگایە نابەم
تابگاتە ئامێزی تۆو ..
نامەی دڵی بۆ بنێرم ،
ئیدی بۆیە ونترم لەو ڕێبوارانەی
بەدوای ویستی دڵیان ماندون ،
ئیشک ترم لەو کێڵگانەی ...
هەتا ئێستاش ...!

هی چ تۆوێکیان لێ نەچاندوون ،

* * *

دەمەوێ تەنیا چەند ساتێ !!
بەتەنیا لەسەر نان خواردن ،
لەیادت کەم ،
بەڵام بێدەنگی ئەوکاتە ..
هێندبەسەبر
بە بەردیدەو بیرما دەکشێ
باشتر تۆ بۆ ناو خەیاڵم و ..
سەرتاپای خوێن ،
رادەکێشێ ،
بۆیە ئازیز ...
تینوترم لەو برسیانەی
سنگی نەوی
بە ئێسکی سنگیان دەکێڵن ،
برسی ترم لەو چینانەی ..

بۆ لەتێ نان ...
گوندو زەوی جێدەهێڵن

* * *

چیم لەدەست هات
بۆ ڕەوینەوەی غەمت ،
دریغیم نەکرد ،
چیم لەدەست هات
بۆ بیستنی وەڵامێکی گەشی دەمت ،
دریغیم نەکرد ،
کۆڵنادەم و بۆ گەڕین بە
باخچەی کەزی و دوندی مەمت !!
هەتا ئێستاش ...
ماندوترم .. برسیترم .. بنزرترم ..

**ئۆتۆنۆمی ژمارە 58ی ساڵی**
**1988**

# برا کوژی

خۆت لە بالای پڕیەدەگ و
باروتاویم مەئاڵێنە ،
بابەجەنگی نێو خوێنم
جەستەی ناسکت هەڵنە قرچێ !
خێرا نیگات بگوازەوە
با بەر تیشکی مایکیا ڤیلیو
لێزەری دیدەم نەکەوێ ،
خێرا نیگات ...

با پەریکی ژوانەکانی ڕوح
لە پێچپێکی نا ئاراما
بەرگیری تفەنگی ئەفکاری
چەوت و گەریدەم نەکەوێ
کەزیە ئەفسوناویەکانت
چیدی لە دەستی بۆن نەویتیم مەئالێنە .
نەبا ڕەنگی هەڵبزرکێو
تاڵ بەتاڵی مووەکان بڕزێن
بەس خۆت لە بالآی من هەڵسوو
با هەناسەم دووربێ لەتۆ ...
نەبا بۆنی گەنیوی نێو سەنگەرەکان
نەرم بۆ نێو دەمت بخزێن ،
باشترە وایە دوور کۆچ کەین و
چیدی ئەم خاکە بە چڵکی
دەستەکانم نەسووتێنم
باشتر وایە زۆر دوور کۆچ کەین
تاکەس بە بۆنم نەکەوێو

لە دۆزەخی ئەم وڵاتە ئاڵۆزەدا
کەس بەڕشاوەنم نەخنکێ ،
باشتر وایە ...
ئاخ چەند باشتر دەبوو هەرگیز
وشەی براکوژی نەبوایە.

**ڕێگای کوردستان ساڵی 1997**

# نامەیەک لە ( قەڵادزێ ) وە

**لەیادی (21)ەمینساڵڕۆژی شەهیدبوونیدا**

هۆ خەڵکینە بمناسنەوە

من شاری چەند جار شەهید و ..

سەرەتای رابوونەکانم

بمناسنەوە ..

من هەتاوی ئازاد بوون و..

بازووي تۆکمەی تێکۆشانم ،

دەرگای گۆڕە کڵۆم دراوەکان هەڵدەنەوە

دوو دوو و سێ سێی
لاشە تێک هەڵکێشراوەکان هەڵدەنەوە
چونکە ئێستاش
لە سنووری شارێکی شەهیددا ونن .
لەنێو شەقاری زامێکی
پڕ لە خوێنێکی لێخنن .

*   *   *

بیست و یەک دانە ساڵە
لەودیو دەرگای دەربەندەوە
شارێکی ون و نەدیووم
ئاخ بیست و یەک دانە ساڵە
لەنێو قەوانێکی گەورەو
بۆمبێکی هەر نەتەقیوم
بمناسنەوە
هۆ خەڵکینە بکوژنی من
بۆ دووبارە لە بەرچاوی شەهیدی

من هەڵواسنەوە .

* * *

شەهیدێکی زۆر بە ئاگام
لەوەتەی ئاسۆ دەسوتێ
سێبەرێکی سەرە ڕێگام
لەوەتەی شاخ و تفەنگ هەیە
من شۆڕشم من پەناگام
ئاخ چەند بزەیەکی نەرمی
خەباتێکی پڕ لە نیگام

* * *

ئەوا ئێستاش
لە نێو رەحمی دایکێکی بڕیێوە وەستاو
چاوەڕوانی دواین ژانم
چاوەڕوانی ..

دواین پارچەی وڵاتەکەم
دواین زایەڵەی هەژانم .
ئاخ خەڵکینە بمناسنەوە
بکوژی دواین پارچەی جەستەی کەوتووم
لەبەرچاوی شەهیدی من هەڵواسنەوە .

**ژمارە 154ی رێگای کوردستان 1995**

# حەزێکی سوور

لە باوەشی ووشە بەهاریەکانت
ڕێگە پێچەکان هێندە روونن
چراخاني شەوە زەنگ و
ئازادی کۆیلەکانی
ئەم ولاتەی تیا دەبینم ،
ئاشنای نهێنیەکانی ناختم
گوێم لە ترپەی جولانەوەو ...
تەواوی بۆ چونەکانتە ،

وام بە هەورازی خەمتەوەو
نیازمە کەمێ
چەپکێ گوڵاڵەی تیا بچنم ،
نیازمە بێنمە جیهانتەوەو
جیهانی خۆشمت بدەمێ .
ئاخ چەند مەبەستم بوو زووتر
یەکتری بناسینەوە .
ئاڵەم خەباتی ناسینە
رابڕ دوومان بسڕینەوە ...

*    *    *

کە لەیادتا پێڵوەکانم شلدەبنەوە
خەو بە داهاتووت دەبینم
لەباوەشی دنیای تۆدا
لە باوەشی ئەفسووناوی
دنیای زۆر تایبەتی تۆدا ...

حەزێکی گەش
وەک چرا لە دڵما دەسووتێ
وەک گوڵ بۆنم پێ دەبەخشێ
ئیدی بۆچی من لە داهاتوو بترسم و؟
تۆش نەگەی بەم حەزە گەشە
ئەوە هەموو مێژووم
گوڵم بۆنی بکە
داهاتوو هەر بۆ تۆ و تەنیا
چڵێ لە سووریتم دەیە ...

**هاوکاری ژمارە1059 ساڵی 1989**

# بەرەو دەستلەملانی ژوانێک

پێ هەڵگەڕێ ...
تاپێ لە توانایدا ماوەو ..
دەم لە بڕکە هەناسەیدا گوڕ
دیارە
پێ هەڵگەڕێ ،
وەی لەو تاوەی ..
کەڕۆ لە ئاساری جوڵەی
دڵ دەگەڕێ ..

لەو تاوانەی ..!؟
کە چرپەی ژوانی ڕۆژگاریٚ
لەبۆ پشوی چەند ساتێکی
خۆشەویستی
بۆ سێبەری گوڵ دەگەڕێ
ئالەو تاوەی ..
کە چاو لە دنیای جوانیدا
بێ گومان و سڵ دەگەڕێ ،
هەردەگەڕێو ..
دیسانەوە هەر دەگەڕێ !؟
پێدەشت .. بژوێن .. بەندەن ..
هەڵدێر
نێرگزەجاڕ هەرد دەگەڕێ ،
بیدۆزەوە ،
کام کەلەبەر سەخت و لێژە
بۆ تۆ پشویە .. هیوایە
حەزە .. پێکەنینە .. چێژە ،

بیدۆزەوەو ..
لە ئاگرو لە زریانیش ..
لە تۆف و .. تەرزەو .. بارانیش
سڵ مەکەوە،
وەرە خەندەو ..
لەم رامان و دوانە گەڕێ
پێ هەڵگەڕێ ..
بۆ ژوانی ئەو بەختە سپییەی
بۆی وێڵی ..
هەر دەگەڕەی ،
دەگەڕەیجێو
دەست لە ملانی باڵاوبەرزنی
چنار دەبی ،
دەگەڕەیجێو..
بە ئاواتی ژوانی یاڵ و ..
کانیو چەم وکەنار دەبی ،
دەمادام ..

بۆ ئەم عەشقەت وا بەتاوی
هەر دەگریەی ،
ئیدی پڕ بە ئارەزوی دڵ
سەر بەمەم و شلكەران كەو
دەست لە ملان بە ،
لە دووای هەر ماچێ لە كوڵەش ،
كەزی بۆن كەو ..
لەسەر ئەو مێرگە بەفرینە
بۆ خۆت تلان بە .

**هاوكاری ژماری 885 ساڵی 1984**

# نیگا

لە چاوانی تۆدا سێبەر ..
یان تارمایی دوو باڵندە
پشکۆی هەناوم گەش دەکا ..
لە گیانیشتدا هاشەی
تاڤگەیەک لە فرمێسک !
ڕووبارێک لە بیرەوەری
هەناسەکانم بۆن دەکا ،
بیرت نەچێ ..!
لە بینینتدا عەشقێکو
نیگایەک دەمارم دەبڕێ

لە دیدەنیمدا فەناو ..
ون بوونی دەیەوێت دواجار
بەئاوازی بتتخەوێنی ،
بیرت نەچی !
ئەگەر بۆ یەکتریش نەبین .
ئەگەر لەنێو چاوە
ئەفسوناویەکانیشتا
نیگای یەکتر نەخوێنەوە ..
واین لەم ولاتە ئالۆزەو
لەنێو ناخی یەکتریدا ،
لەگێژەنی نیگاکانمان
بۆ یەکتری دەتوێینەوە.

*　*　*

نیگاو .. ئایندەو .. تارمایی
ئەو خۆشەویستیەم دەدەنی ..
کە ئازانم هۆگریان کەم ،
لەکەناری رووبارێکا

وەك مەستەكان خوێنم
دەكوڵێو ....
لە شەپۆلەكان دەترسم
لە تاشەو.. تەنانەت هاشەی
تاڤگەكانیش ترسم هەیە
لە لێدانی دڵ و .. ڕۆح و
نیگای خۆشەویستیت نەبێ ،
پێوایە ئایندە ترسەو ..
ترسێ لە هەموو بوون دایە ..
بیرت نەچێ ..!
نەمن هۆگری كەس دەبم
نە دەشزانم تۆ هۆگركەم .
كەچی لە نێوان من و تۆ
ڕۆحت لە ڕۆحی من دەچێ ..
هەناسەكەم ..
بیرت نەچێ !

**ڕێگای كوردستان ژمارە 540 ساڵی2003**

# تاشە

ڕووبارێک تاشەی خۆش ناوێ
لە عاسێ بوونی دەترسێ
دەربەندێکیش لە لافاو ..
شەقامیش لە گریانی هەور،
ئەی ئێمە لەچی بترسین ؟
لە تەقینەوەیەکی ناکاو !
یا خۆکوژێکی حەپەساو ؟

لە ڕیشنێکی بێ ئاگا ،
یا لە بەسەراب بوونی ئایندەو
دەوروبەرێکی پڕ نیگا ،

* * *

تاشەریەک لافاوی ناوێ ،
نێچیریش هەڵۆی خۆش ناوێ
شیوێنک پڕ لە کەفی سوور
ڕێژنە گولەیەکیش لە دوور
لەکام هێڵ ئاڵا داکوتین ؟
بۆ لە ئاینده بترسین !
دایکم هەمووتانی دەوێ و..
نیشتیمانیشی دەوێ و .. .
تەنانەت کۆنگرەو ...
بژاری ..
نێو کورسیەکانیشی خۆش دەوێ .

* * *

ئیدی باموچورکەی نێوان
یا هەڵخلیسکان و ترازان
لە ئەشکەوتێکا گۆش نەکرێ
کە پڕ بێت لە کڵاو رۆژنەو ..
نەتوانێ ئێمە داپۆشێ .
شمشێرێک ژەنگی لێداوەو
قەوانێکیش .
مەلێ کردویەتیە لانە ،
کۆترێ لە نێو بۆسەداو ..
تاشەرێکیش لە گلانە .
زریانێ سنوور لوول دەداو
چریکەیەکیش ئارامی شەو ،
بڵێسەیەک جوانی گوڵ و ...
هاڕەیەک دەنگی بولبول و
لێخۆش بوونێکیش ئایندە ،
لەو کەنارەدا بمناسن ،

*کە شەپۆل دەتوێنێتەوە*
*لە سێگۆشەیەکا بمبینن*
*کە ووشەی تێدا هەڵدەچێ ،*
*باخۆ بەو تاشەیەش بگرین*
*کە گڕکانی لێدەردەچێ .*
*بیرتان نەچێ ؟*

**خەبات ژمارە 1920ی ساڵی 2005**

# قەڵادزێی شەهید

وا ین لە گەرووی قەڵادزێداو نالەی ناپالم دەبیستین
شار شەهیدەو جارێکیتر بۆ راپەرین یەک هەلوێستین
لەناو قەوانێکا شەهید سرووودی ئازادی دەچڕێ
چەند ترسناکە ئەم سەدە دووژمن فرمێسکی من دەسرێ
چەخماخەی راپەرینەکان لێرەوە سەرچاوە دەگرێ
لێرەوە نەورۆزی تینوو ،بازووی تۆکمەی کاوە دەگرێ
لە وەتەی ئاسۆدەسوتێ سێبەرێکی سەر رێگام
لەوەتەی شاخ وتفەنگ هەیە من شۆڕشم من پەناگام

ئێستاش لەنێو دڵی دووژمن هەرمن گڕی ڕاپەڕینم
هەر من شەهیدو تەكان وهەستانەوەو هێزو تینم
گەردەتانەوێ بڵێسەو شمشێری دەستم ببینن
تاشەی قەندیل و شەپۆلی روباری هە ستم ببینن
وەرن بەنێو خوێنی جماودا قەڵای رابوون بناسنە وە
لاشەی قوتابیانی زانكۆو شەهیدی وون بناسنەوە

**گۆڤاری راسان ساڵی 2000**

# بۆنە

سەما لەڕینەوەی گوڵەو
جگە لەلافاوی ناکاو
لە رەشەباو....
رەنوە شێتەکانیش دەترسێ
من و وشەی یاخی بوون و
چرنوکی هەڵۆی خۆشناوێ
هەندێ جاران...
لەگەی باڵی باڵندەو...
ناڵەی هەورو..

تەپەی پێی شایش دەترسێ
جاریش هەیە..
لەشکانی شوشەو..
فیکەی هەرزەیەکی نامۆو
جوڵەو...
شتی ئاسایش دەترسێ،

* * *

سەما لێرە وەکو مەستێ
جیهانی تایبەتی هەیە،
لەناو لانەی مەخۆرێکو
هەرزەکارێکی وشت نەبێ!
ئەو داهێنانەت ناداتێ
یان....
ئەو بادانەی پێنابێ
کە لەرێتی

ئاوازی هەڵپەڕکێدایە
کوڕی دەوێ...
شەپۆلەکانی ناو پەڕۆ
ئارمەکانی سەرچۆپی کێش
بووەشێنێ،
کچی دەوێ
بەپولەکەی هەمەڕەنگو
چەپکە گوڵێکی نیسانی
تەپو تۆزکاو...
سەمایەکی کوردیت داتێ

* * *

لێرە بۆنە
وەکو سەمایەکی ناسک
ببورن وەک شایی گەمان!
هەموو هەر سەکۆیان دەوێ

سەکۆش بەرزەو
هەندێ جاریش هەزم نابێ
بۆنە لێرە....
بۆخاوەنی رەنگەکانەو
چش لەئاڵایەکی رەنگاو رەنگ
گرنگ بۆنە
سەمایەکەو...
بێ بادانو بەزم نابێ.

# هەناسەیەك بۆ نەورۆز

گڕی ئامەدو...
بروسكەی نەورۆزی وێ
هەناسەی ئاگرینیان و
فڕێدانی بەردەكانم دی،
ئاڵای شاراوەی دیاربەكرو
فرمێسكە قەتیسەكانی كوردی
قامیشلی و...
مهابادو...
مەریوان و...

باریکە دووکەڵی لوتکەو

بناری چیاکانم دی،

لاوە پەرتەوازەکانی هەندەران و

کوردەکانی ناو لوبنان و

ئەستەمبوڵ و...

تاران و...

تەواوی دنیام دەدیتن،

بۆ نەورۆز وەک ئاگر وابوون

لەناخی هەر تاکێکیاندا

گیانی بەرەنگاربوونەوەو

خۆشەویستی نیشتمان و

ئازارێکی جێگیر هەبوو،

بەنێو دیمەنەکانا ڕەتبووم

گەڕامەوە ئەو ڕۆژانەی

وەک ئەوان بووین...

وەکو ئەوان

لەپەناوە،

بەدیار دەنگی زیرەکو
ئاگرێکی ئەفسوناوی
بەرەو لوتکە هەڵدەکشاین و
شاریشسان دەکردە ئاگر،
دەبوینە ئەو پشکۆیانەی
بەرەو ئێرەیان هێناین و
لێرەش شنەبای ئازادی
هەموی کردین بەخۆڵەمێش
نەئاگرماو...
نەگیانی نیشتمانی
نەهەڵکشان بەرەو لوتکەو
نەچونە پێش،
بۆیە حەزم دەکرد منیش
لەئامەد یا قامشلی
بەردوو ئاگرم پێبایە
لەوێ بام و...
تێر تێر بەردم

بەدگیرکەران دابایە،
دڵم لەوێ و
لەناو دووکەڵ وپاشماوەی
ئاگرەکاندا دەبرژێ
ئای کەچەندە حەزم لێ یە
وەک هەشتاکان....
وەک لاوەکانی دیاربەکر
لەپەناوە....
نەورۆزم پیرۆزکردایە.

# هەناسەی ـەریلا

دڵم پڕە لەخۆزگەیەک،
لەژێر سێبەری قەندیل و
ئەو ئەشکەوتانەم داناوە
کە بیرەوەریەکانی دوێنێی وەو
قەوانە بەتاڵەکانی وەو.....
دروشمە نیشتمانیەکان و
هەناسەکانی وەیلێیە،
کۆڵە پشتێکم لەپشتە،

پڕ لەکتێب و برسییەتی
پڕ لەسروود،
پڕ لەو ئومێدەی بۆی دەچم
ئاشنای بنار.....
بزنە ڕێیەکانی قەندیلم
هەروەکو وە....
بەمەترسییەکاندا دەڕۆم
بەسەر مینەکاندا باز دەدەم
لەژێر تاشەو....
گابەردەکاندا شەڕ دەکەم
بەرگم وەک هی ئێوە خاکی
هەروەک ئێوە...
لە قەندیلم
لەلوتکەی هەزار بە هەزار
لەنەدیو و نێو شیوێکم
بڵندوکاکی بەکاکی.

*　　*　　*

دڵم پڕە لەنیشتمان
خۆزگەم وەک هەڵۆی بەرزە فڕ
لەنەسرەوتن و بەرخودان،
بەکوێدا بگەمە ئاسۆ....
هەروەک ئێوە
منیش لەوێ دەبیننەوە
جەستەم خوێنی ایێدە چۆڕێ و...
کەچی بەرەو لوتکە دەچم،
ئەگەر لەنەدیوێ کەوتم
ئێوەم هەن و
بیرەوەریەکان هەڵگرنەوە،
بەرەو ئەوکانیانە بچن
کە هێشتا جێ پێی لێیە
ئاخر ئەوێ
هەمان دروشمی جاران و

هەناسەكانی وەی لێیە،

*        *        *

ئەو بنارە....
تەنها ئێسەو ئێوەی دەوێ
ئێوە لەمن،
وێنەی منیش وا لە تۆدا
تاقم تفەنگەكان هەڵگرن
بائەم سێگۆشەیە ئیدی...
بۆ دوژمن...
بكەینە بەرمۆدا.

# کەلەپچەیەک بەکراوەیی
# زنجیرێک لەوێ بەجێما

غاندی دەیویست شەقامو

هەموو جیهان بێ پۆلیس بێ

بەندیخانەکان بۆ باخچەو..

ئیدی کۆیلە دیل نەمێنێ

غاندی ویستی هەمومان...

لەدڵدا وەک پەپولە بین

ئەوکاتەی بەندیەک دەگری

کەلەپچەکان بکرێنەوە...
زنجیرەکان هەڵبوەشێن..
بۆ روخانی سێدارەکان..
دژی جیاوازی ژێردەستی
هەر هەمومان لەجوڵە بین

*    *    *

ئاخر ئەو ..
غاندی ماندو و خوێن شیرین
بەنێو تاوانەکاندا هات
دیلی پەرچی سپی کردو
زۆر سەیر بوو شەهید نەبوو!
زنجیری پێی...
لەبەندیخانە بەجێهێشت
بیرەوەریەکانی هەڵگرت،
چیرۆکە ترسناکەکانی
تیا نوسیەوە،

بەنێو ڕۆمانی دایکو
ڕۆژە توشەکاندا تێپەڕی....
بەو ڕۆژانەی....
ئێستاش هەن،
لەنێو جەنگێکی دژواردان
جەنگی کۆیلەو...
چینایەتی، خوێن مژین...
ئاخ ڕۆژانێک،
پڕ جیاوازیو توندو تیژین.

# تارمایی ببیر

لە بزربوونم مەترسە
وام لەنێو تارمایی بیرتا ..
کاتێ ویستت بمدۆزیەوە ،
وریابە هەڵوێست بیرنەکەی !
وریابە ئەشک نە قوزیەوە !

*　　*　　*

کەبیر لە من دەکەیتەوە ،

پەنجە بزێوەکانت شلکە
چونکە هەڵوەریومە بەرینی
ئەو پەنجانەی خامە دەگرن
چونکە چۆڕاومەتە نێو ئەو ...
ووشانەی تۆیێی نامە دەگرن .

*    *    *

چۆنت وویست وا .. !
لە زنجیرەی ووشەکاندا ڕیزم بکە
چونکە لە تارمایی بیرتام
ووردتر لەگەڵ ....
رستەکاندا بمجوڵێنە
چونکە نیگام ...
لە مەلی حەزی نێچیرتام
پێت وانەبێ ! ...
هەڵمەت بۆ نێچیری حەزت
تەکانی ناکاوی بوێ ...و

پێیت ستەم بێ
لە هەستانتا بەری دیدەت
گێژەڵوکەی خەم و تەم بێ ،
وام لە تارمایی بیرتا ...
کاتێ وویستت بمدۆزیەوە
وریابە ئەشک نەتۆزیەوە .

* * *

ئەو نامەیەی
لە تۆیی دەستتدا دەلەرزێ
نەخشەی گرین ...
بە ترۆسکایی گەوهەرە
لە بزربونم مەترسە ...
چیدی لەنێو وێنەکانا
سۆراغی بونم مەپرسە ،

* * *

حەزت لێیە بمدۆزیەوە
وویستتە لە ئامێزما شلبی
وام لە کۆشتاو ...
دەی بە شانەی پەنجەکانت
پرچی ئاڵۆزم دابێنە
چونکە حەزمە لەگەڵتام
ویستمە گشت دەم
لە مێزتام .

**سەرەتای 1990**

# نیگایەک بیرەدا رەتبوو

نیگایەک بیرەدا رەتبوو
هەر لەناسکی تۆی دەکرد
رەتبووم بەناو ناسکیتدا
هەناسەکان
سەرنجە پڕ لەماناکان....
هێلانەیان
بۆ نیگاکانمان چێدەکرد.

*   *   *

لێرەدا بوو
ئا لەو جێژوانە پڕ شەرمەی
بەڵێنەکانی لێناوە،
هێشتا دەنگدانەوەی چرپەی
وشەکانتی لێجێماوە
ناوی ناوەوەمت ناسی...
ئایندەو جێگەی خۆت دامێ
لێرەدابوو...
لەژوانی ناو شاشە دابوو
نیگایەکی خۆشەویستیی و
هەناسێکی پڕ سۆت دامێ.

*   *   *

هێشتا لەوێ
لەوێی بێ تۆو من و چرپە
سێبەری گەڵاکان ماون

بۆنی هەناسەی بارگاوی
بەترسی یەڤایرۆس بوون و
ونبوونی ژمارەی ئەدرەس و
سووتانی کارتەکان ماون،

*   *   *

لەوێ هێشتا
تابلۆی گیا داچەمیوەکان
ئەوانەی لەژێر تۆدا بوون
هێشتاکە هەر
وەک تۆ خەوتوون
وەک تۆ وێڵو....
وەک منیش چاوەڕێی بارانن.
تابۆنی هەناسەتی لێبێ
هەرهی چ نەبێ
تامی چرپەو
سرتەی کراسەکەتی لێبێ،

* * *

نیگایەک بێرەدا رەتبوو
هەر لەناسیکی تۆی دەکرد
ئاخر بەناسکیتدا هاتم
بۆیە هەردووکمان لێک ونین
ون لەنیگا
ون لەو سایتەی
نیگاو ساتی ڤایرۆس کردین
تانەنامەو
نەیبیێڵمان پێک بگا
تەنها نیگایەک بێرەدا
بەناو سایتەکەما رەتبوو.